# ناسنامەی پەرتوك

**ناوی پەرتوك: خێزانی ئاسودە**

**ئامادەكردنی:  خەمخۆر**

**جۆر: دەرونی-پەیوەندی خێزانی**

**ماڵپەڕی ئامادەكار**

**www.khamkhor.com**

# پێشەکی

بەناوی خودا, ئەم بەرهەمەی بەردەستان, سەد خاڵی پەروەردەیە, کە ماڵپەڕی خەمخۆر لە نامیلکەوە گۆڕیویەتی بۆ بەرنامەی نەزمی ئەندرۆید، وە بەباشم زانی وەریگێڕم بۆ پەرتوکی ئەلیکترۆنی بۆ ئەوەی کۆمەڵێکی زیاتر سود لەم بابەتە ببینن, ئەم سەد خاڵە دابەش کرابو بەسەر پەنجا بەشدا. بەڵام پێم باش بو, بیگۆڕم بۆ چوار وەرز کە هەر وەرزێك بیست و پێنج خاڵ لەخۆ بگرێت.

دەمەوێت ئەوە بڵێم کە كاك خەمخۆر فەرموبوی کە ئەم بەرنامەی لامانە بەستەرەکەی بدەین بەهاوڕێکانمان نەك بەرنامەکە خۆی, بۆ ئەوەی ڕێژەی داگرتنی لە پلەی ستۆر بەرزببێتەوە و بزانێت چەند کەس سودی لێوەرگرتوە و دایگرتوە, بەڵام پێم باش بو نەك بەستەر بەڵکو بیگۆڕم بۆ پەرتوك بۆ ئەوەی هەمو کەس هەر نەزمێك بەکاردەهێنێت بتوانێت سودی لێوەربگرێت.

زیاتر:



# ڕوکاری بەرنامە

خێزانێکی ئاسودەت

بەشی 1

بەشی 2

بەشی 3

بەشی 4

بەشی 5

بەشی 6

## ئاگەداری! 1

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان.

بەڕێزان ئەم بەرنامەیە بەڕاستی ماندووبونی زۆری ویست تا بەرهەم هاتووە ، بەڵام لەبەر ئەوەی کارەکە بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە و بڵاوکردنەوەی چاکەیە و تا خەڵکیش کەڵکی لێوەرگرن . دڵخۆشم بە ماندو بوونەکەم .

تکایە کەس apkئەم بەرنامەیە لای خۆی بڵاونەکاتەوە چونکە ئەوە دەبێتە بێڕێزی بە ماندووبونەکەم ، بەڵام ئەگەر ویستتان ئەم بەرهەمە بڵاوبکەنەوە و هاوڕێکانتان بێبەش نەبن لێی، دەتوانن بەستەری google play بەرنامەکەی بۆ بنێرن . بە

# ناسنامەی بەرنامە

**ناو:** خێزانی ئاسودە.

**بابەت:** ١٠٠ خاڵی پەروەردەیی.

**داڕێژەر و ئامادەکار:** خەمخۆر.

**سەرچاوە:** نامیلکەی ( ئاسودەیی خێزان هەوێنی ئاوەدانی ماڵە ) لە نوسینی برای بەڕێز :حەمەڕەشید پێنجوێنی.

## ئاگەداری! 2

google play بەرنامەکەی بۆ بنێرن . بە ڕێگەی دوگمەی (ناردن) .. بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ لە هەژمارەکەی خۆم دایبەزێنن و ببێتە هۆی پشتگیری و هاندان بۆ کاری باشتر و بە کەڵکتر . پشتیوان بەخوا .

بەهیوای کەڵك و قازانج لەبەرنامەکە و نزای چاکمان بۆ بکەن . زۆر سوپاس بۆ لێدوان و دەنگدانیش لەسەر بەرنامەکە بۆ دەوڵەمەندتر کردنی .

براتان : خەمخۆر

www.khamkhor.com

# وەرزی یەکەم

بۆ بەدەست هێنانی خێزانێکی ئارام و پڕ لە خۆشەویستی, پێویستە زۆر بە وردی ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:

1/ خێزانت بە دڵی خۆت هەڵبژێرە و لەبەر هیچ کەسێك بڕیار مەدە لە هاوسەرگیریتدا.

چونکە بەشێکی زۆر لە کێشەکان لێرەوە دەست پێدەکەن کە بەدڵ و ویستی خۆت ژنت نەهێناوە, بەڵکو لەبەر ئەوەی لە ڕوی کەسێك داماویت یان لەبەر هەر ناچاریەك بێت بڕیارت داوە کچ بیت یان کوڕ, کە ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و دواتر وردە وردە ژیانت لێ تاڵ دەکات, بەوەی ماوەیەك پێکەوە دەبن و زیاتر لەسەر پێی خۆت دەوەستیت و ئەو کەسەی کە بوەتە هاوسەری تۆ و لەسەر بنەمایەکی تەندروست هەڵنەبژاردوە، ئینجا سەرەتای ناکۆکی دەست پێدەکات, بۆیە ئەو کەسانە نابنە کەسێکی خۆشەویست بۆ یەکتر, کە خۆشیشت نەویست ئیتر هەوڵ نادەیت دڵسۆزی بۆ خەرج بدەیت وماڵەکەی بۆ پڕ لە خۆشی و کامەرانی بکەیت. هەروەك پێشینان وتویانە: بە زۆر بتنێرن بۆ مازو کردن بە دارەکەیدا ناڕوانیت. لە یادم دێت برایەك لەبەر ئەوەی لە ڕو دامابو کە هاوسەرەکەی مارەبڕی بو, دوای مانگێك دەیویست خێزانەکەی تەڵاق بدات, وتمان بۆ؟ وتی: چونکە ڕوخساریم بەدڵ نیە.

یەکێکی ترم بیردێت ئەی وت: هەمو ڕۆژێك دەڕۆمەوە بۆ ماڵەوە لە خێزانم دەدەم, دایکی پێنج منداڵیش بو, ئەی وت: هاوسەرێکی زۆر باشە و هیچ

گوناهیشی نیه, تەنها ڕوخسار و شێوەی جوان نیه له لام. دواتر بویه هۆی ژیان لەدەست دانی هاوسەره بەستەزمانەکەی, که دەوترا خۆی سوتاندوه, هەندێکیش دەی وت: مێردەکەی خنکاندویەتی.

له پێشەوا عەلی (ڕ.خ) دەگێڕنەوه که فەرمویەتی: سەرم سوڕدەمێنێ له پیاوێك که له هاوسەرەکەی خۆی دەدات له کاتێکدا خۆی شیاوتره بۆ لێدان.

2/ به پێی توانای دارای خۆت ماڵەکەت به دڵی خێزانت بڕازێنەرەوه و هاوسەرەکەت چۆنی پێ خۆشه وای بۆ بکه, چونکه ڕازاندنەوەی ماڵ به دڵی هاوسەرەکەت, وا دەکات قسەڕەوا و خۆشەویست تر بیت لای, به تایبەتی ئەوانەی که خێزانەکانیان کار ناکەن و زۆر ترین کاتیان له ماڵەوه بەسەر دەبەن, یان ئەو هاوسەرانەی له هەندەران دەژین دور له کەس و کار و زۆر ترین کاتیان له چوارچێوەی خانویەکدا بەسەر دەبەن, چونکه پیاوەکەی دەتوانێت بڕوات بۆ هەمو شوێنێك و هاوسەرەکەشی زۆربەی کاتەکانی خەریکی کاری منداڵ بەخێوکردن و خزمەت کردنی ماڵ دەبێت, ستەمێکی گەورەیه ئەگەر ماڵەکەی بۆ جوان و ڕازاوه نەکەین وەکو ئەوەی که ئەو دەیەوێت و ئەگەر وانەکەیت توانای مرۆڤ دیاریکراوه و ئەویش دڵخۆش نابێت پێت و کێشه ورده ورده سەر هەڵدەدات و سەرەتای کێشەش به بچوکی دەست پێدەکات و دواتر هێنده گەوره دەبێت که ئاسان نیه چارەسەر کردنی.

له یادم دێت هاوسەرێك داوای کرد کە مێردەکەی دەرامەتێکی زۆر باشی هەبو ژوری میوانەکەی بۆ جوان بکات, کە تەباخێکی ڕزیو و ڕاخەرێکی زۆر پیس و پۆخڵی تیابو کە نەك تەنها ژوری میوان, بەڵکو چێشتخانەیماڵەکەشیان بو کە بە پارەیەکی کەم دەیتوانی ئەو گۆڕانکاریەی بۆ ئەنجام بدات، بەڵام بۆی نەکرد و لەسەر ئەوە کێشەی گەورەیان بۆ دروست بو کە نزیك بو جیا بنەوە له یەکتری. هەروەها هەر گۆڕانکاریەك خێزانت دەیکات له سنوری ماڵەوەدا, بە ئاسای وەری بگرە و دەست خۆشی لێ بکە, ئەگەر بە دڵی تۆش نەبێت, چونکە ئافرەتان ئارەزومەندی ئەوەن کە ناوبەناوێك جێ گۆڕکێ بکەن بە شوێنی شتەکانیان لە ماڵەوە. من جاری وابوە ڕۆشتومەتەوە بۆ ماڵەوە ژوری نوستن یان ژوری میوان شتەکانی گوازراوەنەتەوە له لایەکەوە بۆ لایەکیتر لەوانەیە بە دڵی منیش نەبوبێت, بەڵام من سوپاسم کردوە و دەستخۆشیم لێکردوە, بۆ ئەوەی ئەو ماندوبونەی ئەو بە کەم نەزانم و زۆر جاریش هاوکاری زۆرم کردوە بۆ ڕێکخستنی ماڵ بە دڵی ئەو, بەو هۆیەشەوە ئارامیەکی زیاتر بەدی دەکرێت لە ماڵەکەماندا.

3/ ئەگەر هاوسەرەکەت شتێکی شکاند یان زیانێکیدا, ئارام بە لەگەڵی و توڕە مەبە و ئاسای وەری بگرە, چونکە تۆش پێشتر زیانت داوە و حەزت نەکردوە کەس سەرزەنشتت بکات, چونکە هیچ کەس حەزناکات هیچ زیانێکی لێ بکەوێت. ئەوەی کە ڕویداوە بە ویستی خۆی نەبوە تا سەرزەنشتی بکەیت لەسەری.

4/ دەست قونجاو مەبە بەرامبەر ماڵ و منداڵەکانت ئەگەر دەرامەتت هەبو, گونکە بژێر مەبە و مەپرسەرەوە لەو شتانەی پێشتر کڕیوتە و خوراوە و نەماوە, ئەگەر داوای شتێکت لێکرا بیکڕیت بۆ بژێوی ڕۆژانەتان, مەڵێ خۆ من چەند ڕۆژێك لەمەوبەر کڕیم چی لێهات, بۆچی زو خواردتان, برایەك بۆی گێڕامەوە کە هاوڕێیەکی نانی ناو تەشتەکەیانی لەناو سندوقێك کلیلی دەدا و ڕۆژانە تەنها چوار نانی دەردەهێنا بۆ خێزانی. یان کەسێکی تر ناوبەناوێك لەناکاو دەگەڕایەوە ماڵەوە تا بزانێت کێ هاتوە بۆ میوانی هاوسەرەکەی و چی بۆ لێناون و چیان دەداتێ, ئاخۆ ئەم جۆرە کەسانە بۆ تەنها ساتێکیش دەتوانن خێزانێکی کامەران بە دەست بهێنن؟

5/ بەهێز کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کەس و کاری هاوسەرەکەت لە ڕێگەی هەواڵ پرسینی تەلەفۆنی یان سەردان کردنیان, بەتایبەت زو پەیوەندی کردن بە پیرۆزبای کردن, یان ناردنی خەڵات لەکاتی شادیەکاندا وەك پێکهێنانی هاوسەرگیری و دەرچون لە قوتابخانە و منداڵبون..هتد. هەروەها بە دڵدانەوە و سەرەخۆشی لەکاتە ناخۆشەکاندا وەك مردنی کەسێکیان یان زیان لێکەوتنیان..هتد، بە تایبەت لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و برای هاوسەردا، هەروەها بەپێی توانا یارمەتیدانیان لە ڕوی داراییەوە ئەگەر پێویستیان پێی بو.

6/ سوپاس کردن لەسەر کارە باشەکان یان بەکارهێنانی وشەی هاوسەرە خۆشەویستەکەم, ژنە باشەکەم یان هەر وشەیەکی شیرینی تر, هەمو ئەوانە پەیوەندی نێوانتان بەهێزتر دەکات.

7/ هەرگیز لەپێش چاوی هیچ کەسێك گلەی لەیەکتر مەکەن, تەنانەت لەپێش چاوی دایك و باوك و خوشك و برا و کوڕ و کچەکانیشتاندا.

8/ لەبەر چاو خێزانەکەتدا باسی جوانی هیچ کەسێکی تر مەکە, چونکە بێ متمانە دەبیت لای هاوسەرەکەت, ئەگەر بە گاڵتە و بۆ خۆشیش بێت. لای بەرامبەرەکەت وەکو ڕاستی دەژمێرێ و دور بێت یان نزیك کێشەت بۆ دروست دەبێت لەسەر ئەو قسەیە. ڕۆژێك کەسێك لەگەڵ خێزانیدا دەچێت بۆ بازاڕ بۆ کڕینی پێداویستیەکانیان بە هاوسەرەکەی دەڵێت: ئەو کچە کەلەسەر سندوقی پارەکەیە شێوەی جوانە, تەنها ئەو وشەیە پاش چەند ڕۆژێك کێشەیەکی گەورەی لەسەرکەوتەوە کە بۆ ماوەیەك ژن و مێردەکە لە دو ماڵی جیادا دەژیان و زۆر نزیك بو لێك جیا ببنەوە بەتەواوی.

9/ هەرگیز بەسوکی باسی دایك و باوك و کەسوکاری هاوسەرەکەت مەکە و خۆت دوربگرە لە گلەی لێکردنیان, ئەگەر چی هاوسەرەکەت زیاتر لە تۆ گلەی

**هەبێت لێیان, چونکە هەر چۆنێك بێت ئەوان کەسی یەکترن و دەکرێت نێوانیان باش بێت و شتی کۆن لە بیربکەن، بەڵام تۆ کە هاوسەری ئەویت زیاتری دەوێت بۆ چاوپۆشی لێ کردنت و هاوسەرەکەت کاتێك زانی کە ئەگەر چی ئەو گلەییان لێدەکات و دلگرانە لەگەڵ ماڵی باوکی یان لەگەڵ برا و خوشکەکانی, بەڵام هاوسەرەکەی جگە لە قسەی چاك, خۆی بەشدار نەکردوە لەو نێوەندەدا. ئەوا وا دەکات کە زیاتر جێگەی متمانەی بێت و خۆشەویستی زیاتر جێگیر دەکات لە دڵیدا.**

**10/ هەوڵبدە تا دەتوانی کاروکاسپی کردنت هاوبەشی مەکە لەگەڵ ماڵی خەزورانت, چونکە زۆر جار مرۆڤەکان گلەییان بۆ دروست دەبێت لەسەر یەکتری بەهۆی ماڵی ژیان(دونیا), ئەوەش دەبێتە هۆی دروست بونی ساردی و کەم بونەوەی خۆشەویستی لە نێوان تۆ و ئەواندا و خێزانیشت ئەگەر چی ئێستا بوەتە بەشێك لە تۆ بەڵام بەشێکی سەرەکیشە لە ماڵە باوانی و بەو پێیە کێشەکە ناوماڵەکەی خۆیشت دەگرێتەوە.**

**11/ پاراستنی ماف و ویستی هاوسەرەکەت لە ڕوی سەرجێی کردن, چونکە بەردەوام کاری زۆر کردن و پارە پەیداکردن هەمو شتێك نیە بۆ هاوسەرەکەت, چونکە ئەوە تەنها لایەك ئاوەدان دەکات بەڵام لایەکی تر فەرامۆش دەکات.**

زۆر جار مێردەکان لە وەڵامی گلەی خێزانەکانیان کە داوا دەکەن زیاتر بکەونە ماڵەوە و فەرامۆشی لایەنی سۆز نەکەن, دەڵێن ئێمە بۆ ئێوە هەوڵدەدەین و دەمانەوێت ژیانێکی خۆشتان بۆ دابین بکەین, بەڵام ئەو وەڵامە ئاوی دڵەکان نادات, هاوسەرەکان ئەوەیان ناوێت بە تەنها لایەك ئاوەدان بکەیت و لایەکی تر فەرامۆش بکەیت.

هەروەها هێندە کارمەکە کە ڕۆژانە زۆرترین کات لە هاوسەرەکەت دوربیت و کە گەڕایتەوە ماڵەوە ماندو و بێتوانا بیت و یەکسەر بۆ ناوجێ و بۆ خەوتن, ئیتر مافی خێزانەکەت چۆن دەدەیت, بە هەمان شێوەش نابێت ئافرەتان بە زۆری سەرقاڵی کاری ماڵ بن و پەروەردەی منداڵ بن و مێردەکانیان فەرامۆش بکەن, چونکە نابێت مافێك بدەیت و مافێکی تریش پشت گوێ بخەیت.

12/ هاوسەرەکان پێیان خۆشە مێردەکانیان ناوبەناوێك پێکەوە بازاڕ بکەن نەك بە تەنها بچن, کە ئەوە حەزێکی گرنگی ئافرەتانە و نابێت فەرامۆش بکرێت. هاوسەری وا هەیە خێزانی دەبات بۆ بازاڕ و خۆی لە شوێنێکدا لەناو ئۆتۆمبێلەکەیدا چاوەڕوانی دەکات, لەبەر ئەوەی پێی خۆش نیە (تاقەتی نیە) لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بازاڕ بکات. چەندجار کێشەی کۆمەڵایەتی دروست بوە لەبەر فەرامۆش کردنی ئەم بوارە.

13/ ئەگەر پلەی خوێندەواریت زیاتر بو هەرگیز مەیدە بە ڕوی هاوسەرەکەتدا کە ئەو خوێندەوار نیە یان خوێندەواری کەمە, یان تۆ ڕۆڵەی دەوڵەمەندی و ئەو هەژار و نەدار, یان تۆ دانیشتوی شار و ئەو لادێ...هتد. چونکە پێش هاوسەرگیریتان هەر دولاتان ڕازیبون بەو ئاستەی یەکتری و باسکردنی دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی ڕازیبونتان و ئەنجامدانی ستەمە بەرامبەر بە یەکتری و خۆشەویستی زۆرکەم دەکاتەوە لە نێوانتاندا.

14/ ئەگەر هەڵەیەکت بینی لە هاوسەرەکەت زۆر بە گەورە مەیگرە لەسەری و بە چاوی سۆز و لێبوردنەوە تێی بڕوانە, بزانە ئەو هەڵەیە لە دوژمنەکەتەوە نیە, بەڵکو لە دۆستەکەتەوەیە بەڵام کام دۆست, باوکی یان دایکی منداڵەکانتە, هاوڕێی تەمەنتە, ساڵانێکە لە ماڵێکدا پێکەوە دەژین, لە ژورێکدا و لەسەر جێیەك پێکەوە دەخەون, هەر دولاتان ماڵی پڕ سۆزی دایك و باوکی خۆتان بەجێ هێشتوە و کامەرانیتان لە ماڵە خنجیلانەکەی خۆتاندا بەدی کردوە، دەی ئیتر چۆن دەبێت هەمو ئەوانە تکای (شەفاعەتی) تەنها هەڵەیەکی ئەو هاوەڵە خۆشەویستەی تۆی پێ نەکرێت.

15/ منداڵەکانتان بە ڕێکەوتنی هەر دولا ناوبنێن, چونکە هەر دولا هاوبەشن لە خاوەنداریێتی ئەو منداڵەدا و ناکرێت یەکلایەنە بڕیاری لەسەر بدرێت و

بۆچونی بەرامبەرەکەت بە هەند وەرنەگریت, چونکە زۆر جار ئەمەش کێشەی گەورەی لەسەر دروست بوە.

16/ ئەگەر کێشەیەکتان هەبو بە خۆتان چارەسەر نەدەکرا دوای مەخەن و بە زوترین کات لای کەسێکی دڵسۆز بە هەر دوکتان بیدرکێنن, بۆ ئەوەی بە زوترین کات چارەسەر بکرێت, چونکە زۆربەی کێشەکان سەرەتا بچوك بون و چارەسەر نەکراوە تا گەورە بوە و ئیتر چارەسەرەکەشی قورستر بوە.

17/ هەوڵبدە بە تەنها بەشداری کارە چاکەکان مەکە و هاوسەرەکەشت بەشداری پێ بکە, وەك بەجێ هێنانی فەرزی حەج و عەمرەکردن و لە گەشتەکانیشدا بە هەمان شێوە کاتێك بۆ پشودانی خۆت سەردانی شارێك یان وڵاتێك یان هەر شوێنێکی ترت کرد ماڵ و منداڵەکانیشت بێبەش مەکە لێی, چونکە باوەڕداری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە, ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆش بێت بۆ باوەڕدارانی تریش دەبێت پێی خۆش بێت (فەرمودەی پێغەمبەر"د.خ").

وە نزیکترین کەسیش بە تۆ هاوسەر و منداڵەکانتە.

18/ خۆت دوربگرە لەو وشانەی کە دڵەکان دەڕەنجێنن وەك پێی بڵێی تۆ جوان نیت, یان جنێودان بە خۆی یان بە کەسوکاری, کە ئەمانە لەگەڵ ئەوەی حەرامن و شیاوی مرۆڤی ڕۆشنبیر نین, بۆشای نێوانتان زیاتر دەکات و بەرە و قەیرانت دەبات.

19/ گوناه و تاوانی هیچ یەکێك لە کەسوکاری هاوسەرەکەت مەلکێنە بە هاوسەرەکەتەوە و کاتێك ساردیەك کەوتە نێوانتانەوە پێی مەڵێ تۆش هەر وەکو فڵان کەسی خزمتان یان وەك ئەوانت لێدەردەچێت...هتد.

20/ ئەگەر ویستت شتێك بە خێزانت بڵێی کە بیکات, وەك خاوێن ڕاگرتنی ماڵ یان ئەنجامدانی کارێك, ئیتر ڕۆژانە مەیلێرەوە پێی, چونکە لەبەر چاوی سوك دەبیت و داواکەشت ئاسای دەبێت لەلای و دواتریش وەکو پێویست بۆت ئەنجام نادات, چونکە هەر شتێك بە زۆر بە کەسێکی بکەیت بە جوانی بۆت جێبەجێ ناکات.

21/ هەمو کارەکانی ماڵ بە تەنها ئەرکی سەرشانی هاوسەرەکەتی مەزانە, بەڵکو خۆیشت هاوکاری بکە, چونکە بە هاوکاری کردنت کارەکان باشتر و زوتر ئەنجام دەدرێت و خۆشەویستریش دەبیت لای.

گوێ بە شەرم و (عەیبەی) خەڵکیش مەدە, شەرم ئەوەیە کە هاوکاری خێزانەکەت نەکەیت و هەمو کارەکان بە ئەرکی ئەو بزانیت و خۆیشت پاڵ بدەیتەوە و دەست لە هیچ کارێك نەدەیت, چونکە پێغەمبەر (د.خ) زۆرجار یارمەتی هاوسەرەکەی دەدا و بەڵکو پۆشاکەکانی خۆشی بە دەستی خۆی دەشۆرد.

بەداخەوە هەندێك هاوسەر پێی شورەییە ئەگەر بوتڵێك شیر بگرێتەوە بۆ منداڵەکەی, لە کاتێکدا کە خێزانی سەرقاڵە بە کاروباری ماڵەوە, تەنانەت کەسی وام دیوە خێزانی لەبەر ئەوەی خەریکی ئامادەکردنی منداڵەکانی بوە بۆ قوتابخانە و سەرقاڵ بوە پێیانەوە, سەماوەرەکەی گەرم کردوە و قۆریەکیش چای لەسەری داناوە و شەکریشی لەناو پیاڵەکە کردوە بۆ هاوسەرەکەی و ماستیشی لەسەر سفرەکە بۆ داناوە, مێردەکەی ئامادە نەبوە بە دەستی خۆی چایەك تێ بکات بۆ خۆی و داوای لە خێزانی کردوە کە هەر چەندە سەرقاڵی منداڵ ئامادەکردنە بۆ قوتابخانە هەر دەبێت ئەو بێت و چاکەی بۆ تێبکات!

هاوسەرەکەشی دەرفەتی ئەوەی نەبوە, بۆیە مێردەکەی سفرەکەی بەجێ هێشتوە و چوە لە بازاڕ گۆشتی برژاوی خواردوە؟!

22/ ئەگەر هەڵەیەکت بینی لە هاوسەرەکەت یان هەر کارێکی کرد بەدڵی تۆ نەبو خێرا بڕیار مەدە لەسەری و بزانە بۆچی وای کردوە, لەوانەیە دوای ڕون کردنەوە تۆش ڕازی ببیت و کێشەش دروست نەبێت لە نێوانتاندا.

23/ هەوڵبدە بە وشەی شیرین کەم و کورتیەکان چارەسەربکە و هەرگیز پەنا مەبە بۆ لێدان و توندوتیژی, چونکە هەرگیز بە توندوتیژی کارەکان باشتر ناکرێن و سەقامگیری دروست نابێت.

24/ بە هیچ شێوەیەك باسی هاوسەرەکەت مەکە لای کەسانی تر, چونکە بەردێك بۆ ئاسمانی هەڵبدەیت هەر بۆ سەر خۆت دەگەڕێتەوە و کێشەکەیشت بەوە چارەسەر ناکرێت و شکۆیشت لەبەرچاوی خەڵکی کەمتر دەبێتەوە.

25/ ناوبەناوێك خەڵاتێك بکڕە بۆ هاوسەرەکەت, چونکە خەڵات خۆشەویستی زیاتر دروست دەکات.

## وەرزی دووەم

26/ هاوسەری باش ئەوەیە بە بون و نەبون ڕازی بێت و پەستان دروست نەکات لەسەر هاوسەرەکەی بەهۆی کەم دەرامەتیەوە, چونکە کامەرانی و ئارامی ماڵ لە هەمو سامانی جیهان باشترە و مەرجیش نیە بونی سامانی زۆر دڵخۆشی پێوەبێت.

27/ هەمیشە گەشبینانە لە هاوسەرەکەت بڕوانە، هەر وەك تێڕوانینی گەشبینانەت بۆ پەرداخێك ئاو کە تەنها نیوەی تیایە, تۆ دڵخۆشبە بەوەی نیوەی پڕە نەك بەوەی نیوەی بەتاڵە.

28/ بزانە هاوسەرەکەت ساڵانێکی زۆرە دایك و باوکی پەروەردەی دەکەن و ئەرکێکی زۆریان لەگەڵ کێشاوە تا کراوە بەو کەسەی ئێستا هاوسەری تۆیە, بۆیە وەك ڕاسپاردەیەك (ئەمانەت) دایانە بەتۆ, چونکە بەجێی متمانە و سەر ڕاستیان زانیویت, بۆیە هەر ستەم کردنێك لێی, ناپاکی کردنە لەو ڕاسپاردەی کە پێیان داویت, بۆ هەمیشە ئەبێت بەو چاوەوە تێی بڕوانیت.

29/ ئەگەر هاوسەرەکەت منداڵی نەبو بە هەڵەی ئەوی مەزانە, ئەو زیاتر لە تۆ ئارەزومەندی هەبونی منداڵە, یان ئەگەر کچی بو ئاسودەبە و گلەی و ناڕەزای دەرمەبڕە بەرامبەری, چونکە هەمو ئەوانە تەنها ویستی خوایە و بە ویستی مرۆڤ نابێت.

30/ بەراورد مەکە لە نێوان هاوسەرەکەت و کەسێکی تر, چونکە ئەمە بەشی تۆیە و هەوڵبدە ڕازیبە بەم بەشەت, بەوەماڵەکەت بە ئاوەدانی دەمێنێتەوە, چونکە ئەو باشیانەی کە لە هاوسەرێکی تردا دەیبینیتەوە تەنها لە دورەوەیە

**و لەوانەیە هەندێك هەڵسوكەوتی تری وای هەبێت كە تۆ نایبینیت كە بۆ تەنها یەك ڕۆژیش نەتوانیت ژیانی لەگەڵ ببەیتە سەر.**

**پێشینان وتویانە: دەنگی دەهۆڵ لە دور خۆشە.**

**31/ هەوڵمەدە زۆربەی كات درەنگتر لە هاوسەرەكەت بخەویت, چونكە ئەوە پێچەوانەی حەزی هاوسەرەكانە و سەرەتایەكە بۆ دروست بونی نارەزای, ئەگەر چی كاری پێویستت هەبێت بیانودار بێت, بەڵام بەردەوام بونت لەسەر ئەو كارە سەرەنجامەكەی هەر باش نابێت.**

**32/ هەوڵمەدە بە تەنها شەوانە بچیتە دەرەوە لەگەڵ هاوڕێكانت, بۆ ئەوەی بە دەمەتەقێ شەو بەسەربەریت و خێزان و منداڵەكانت بەتەنها بەجێ بهێڵیت, چونكە تۆ خێزانداریت و سەردەمی زگوردیت وەلاناوە و بەتەنها نیت و ئەرك و پێویستیەكت لە ئەستۆدایە و نابێت فەرامۆشی بكەیت.**

**33/ هەتا بۆت دەكرێت كاتێك هاوسەرگیریت ئەنجامدا, بە تەنها بژی لەگەڵ خێزانت و لەسەر ماڵی باوكت مەبە, چونكە كەم جار هەبوە كێشە دروست نەبوبێت لەسەر ماڵە باوك, بۆیە باوك و دایكی دڵسۆز و دور بین ئەوانەن كە كوڕەكانیان لەسەر ماڵ دانانێن و ماڵی تایبەتیان بۆ دەگرن, چونكە ئەوە**

پارێزەری ڕێز و شکۆی ماڵە باوانە و بۆ کوڕ و بوکیش ئاسودەی و لەسەر پێ وەستانی خۆیانە.

34/ دڵت پیس نەبێت بەرامبەر هاوسەرەکەت, چونکە دڵپیسی هەورێکی ڕەشە و هەرگیز بارانی ڕەحمەتی پێ نیە, جگە لە تێکدان و لە بن هێنانی ماڵ, دڵپیسی سەردەکێشێت بۆ سەرجەم بوارەکانی ژیانت و گشت دەروازەکانت لێ دادەخات و هەمیشە بۆ هەر قسەیەك و بۆ هەر تێڕوا نینێك ڕەشبینی خۆی پێیە. ئەو کەسانەی توشی ئەم نەخۆشیە دەبن تەنها بە کاری دڵەوە ناوەستن بەڵکو چاودێری تەلەفونی هاوسەرەکانیان دەکەن, تەنانەت لەکاتی پێکەوە چونەدەرەوەیان یان تەماشاکردنی تەلەفزیۆنەکانیان بەردەوام چاویان لەسەریان دەبێت و چاودێریان دەکەن تا بزانن چاویان بۆ ئافرەت دەڕوانێت یان نا، کە ئەمەش دەردێکی کوشندەیە و ژیان تاڵ دەکات. یاخود پیاوان کەسی وایان تێدایە کە دڵپیسن بەرامبەر خێزانەکانیان, بەڕادەیەك کەسی وا هەبوە تەلەفۆنی بۆ هاوسەرەکەی کردوە کە ئێستا لە کوێی.

دەڵێ: لە ماڵەوەم.

دەڵێ: باشە تەلەفزیۆنەکە هەڵبکە و بیخەرە سەر فڵانە کەناڵ.

بۆ ئەوەی گوێی لە تەلەفزیۆنەکە بێت و دڵی ئاو بخواتەوە کە خێزانی لە ماڵ نەچوەتەدەر, دڵپیسیەك بگاتە ئەو ڕادەیە, ئایا لە باربردنی سەرجەم خۆشەویستیەکانی نێوانیان نیە؟

35/ ئەگەر هاوسەرەکەت بینی توڕەیە, ئەوە بزانە توڕەی هاوسەر لە خۆشەویستیەوە سەر دەردەکات نەك دوژمنکاری, بۆیە کەمێك دانبگرە بە خۆتدا زۆر زو توڕەیەکەی دەڕەوێتەوە و دەچێتەوە دۆخەکەی جارانی و لە ناخیدا پەشیمان دەبێت لەوەی کە کردویەتی, بۆیە زۆربەی کێشەکان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە نیگەران بونی یەکێك لە هاوسەرەکان وەك نیگەرانی ناحەز و دوژمنکار ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت, بۆیە وەڵامی توڕەی بە توڕەی دەدەنەوە و ڕێگا یەکی ناتەندروست دەگرنە بەر لەو نێوەندەدا و کێشەی لێ دەکەوێتەوە.

ئێمە لەبەر ئەوەی کە مرۆڤین بە دڵنیاییەوە هەڵەمان لێ دەبینرێت و دەبێت چاوپۆشی بکەین لە یەکتری، نابێت وا هەست بکەین کە هەرگیز نابێت پێچەوانەی ویستی ئێمە هەڵسوکەوت بکرێت.

پێشینان وتویانە: کێشەی نێوان ژن و مێرد وەك بەفری بەهار وایە و زۆر خۆی ناگرێت و زو دەتوێتەوە.

ئەگەر ڕەفتارێکی هاوسەرەکەت پێ باش نەبو بزانە کە ڕەفتارێکی تری هەیە تکا بکات بۆ ئەوەکەی تری.

36/ پێویستە هاوسەرەکان ئەوە بزانن کە ڕاستە هاوسەرگیری دەکەن و خانەوادەیەکی نوێ پێك دێنن, بەڵام ئەوە ناگەیەنێت مادام هاوسەرگیریت کردوە لەگەڵ کەسێك ئیتر ئەبێت ئەویش لە هەمو شتێکدا گوێ لە مشتی تۆ بێت و وەکو تۆ بیربکاتەوە, ئەمە تێڕوانینێکی زۆر هەڵەیە هەر ئەوەیشە ئارامی بەشێك لە خانەوادەکانی تێکداوە و کێشەی گەورەی لێکەوتوەتەوە, چونك دو هاوسەر لە دو خانەوادەی جیاواز, دو مێشکی جیاواز, دو ڕەگەزی جیاواز, چۆن دەگونجێت بە یەك شێوە بیربکەنەوە, بۆیە کارێکی ئاساییە شتێك لای تۆ پەسەند بێت بەڵام لای ئەو وا نەبێت, یان تێڕوانینت بۆ شتێك پێچەوانەی تێڕوانینی ئەو بێت و بە پێچەوانەشەوە, هەمو ئەمانە دەبێت بە ئاسانی وەربگیرێت, بەڵام دەکرێت بە دانای و بە سانای و بەبێ توندوتیژی هاوسەرەکەی خۆت بهێنیتە سەر ڕاوبۆچونەکانی خۆت و بۆشای لە نێوانتاندا کەمتر بکەیتەوە, هەندێك بیروبۆچون و ویستی پێویست کە ڕەنگ دەداتەوە لە یەکێك لە هاوسەرەکاندا وەك باوەڕداری, نوێژکردن, پۆشینی پۆشاکی داپۆشراو یان تێڕوانینی ڕامیاری (سیاسی) یان هەر شتێکی تر کە ڕەنگی زیاتری دابێتەوە تیایاندا دەبێت پێش هاوسەرگیری یەکلا بکرێتەوە لە نێوانیاندا و

جۆرێك سازش هەبێت لەسەری دەنا دواتر لەوانەیە كێشەی گەورەی لێ بكەوێتەوە.

37/ دەبێت دایك و باوك پێكەوە خۆیان یەك ڕاوبۆچون بكەن لەسەر پەروەردەكردنی منداڵەكانیان و بونی دو بۆچونی جیا لەسەر پەروەردەی منداڵ, دەبێتە هۆی دروست بونی ناتەبای لە نێوان ژن و مێردا و منداڵەكانیش ڕەنگ دانەوەی خراپیان لەسەر دروست دەبێت.

38/ وشەی شیرینی پڕ لە خۆشەویستی و ڕێزدار بەكاربهێنە بۆ مامەڵە كردن لەگەڵ هاوسەرەكەت, چونكە تەنها یەك وشەی شیرین بەسە بۆ ڕەواندنەوەی شاخێك لە دودڵی و سارێژكردنی زامەكان و تواندنەوەی ناحەزیەكان.

پێشینان وتویانە: مار بە قسەی خۆش لە كون دێتە دەر.

39/ هەرگیز ویستی خۆت بە زۆر مەسەپێنە بەسەر هاوسەرەكەتدا, چونكە لەوانەیە بەسەر زارەكی وا بزانیت بە گوێت دەكات, بەڵام دڵی ئەو گوێ بیستت نەبوە و ناشبێت چونكە بە زۆرە.

40/ ئەگەر دەتەوێ بەرگەی ناحەزیە دەرەکیەکان بگریت, هەرگیز کارێك مەکە ماڵەکەت پشێوی تێبکەوێت, چونکە ئەگەر ماڵەکەت ئاوەدان و تەبا بێت, زۆر بە ئاسانی زاڵ دەبیت بەسەر تەنگ و چەڵەمەکانی ژیاندا و هیچ ناحەزێك ناتوانێت پشتت بدات لە زەوی, بە پێچەوانەشەوە ئەگەر وانەکەیت هەمیشە لاواز و ژێر کەوتە و دڵغەمگین دەبیت و چێژ لە ژیانت ناکەیت, ئەگەر چی بە ڕواڵەتیش وا خۆت نیشان بدەیت دڵخۆش و نەبەزیت, بەڵام بۆ خۆت دەزانی کە پێچەوانەکەی ڕاستە.

41/ ڕێگە مەگرە لە هاوسەرەکەت ئەگەر ویستی سەردانی ماڵی باوکی و برا و خوشکەکانی بکات, یان بە پێی توانا یارمەتیان بدات, چونکە پیاوان کەی ویستیان بە مافی خۆیان دەزانن کە بچن بۆ ماڵە باوان و برا و خوشکەکانیان و دەست ڕەهایش دەن لە یارمەتی دانیان, دەی کەوایە بۆچی ئەبێت بە هەمان شێوەیش ماف نەدەیت بە خێزانەکەت کە ئەویش ئازاد بێت لەو مافەیدا, لە کاتێکدا ئەویش وەکو تۆ سۆزی هەیە و بگرە ئافرەتان سۆزیان زیاتریشە.

لە هەمان کاتیشدا زیادەڕەوی لەو سەردانیانەدا لەوانەیە ببێتە هۆی دڵگران بونی هاوسەرەکەت و بەمەش ئەگەر چی مافی خۆت دەستەبەر کردوە, بەڵام مافی بەرامبەرەکەت نە پاراستوە, بۆیە پێویستە ڕەچاوی هەر دولا بکرێت بۆ ئەوەی کێشەی لەسەر نەکەوێتەوە.

42/ هەوڵبدە هەرکات چویتە دەرەوە با هەردوکتان بزانن و کاتێکیش لەبەر هۆکارێك دواکەوتیت بۆ گەڕانەوە هاوسەرەکەت ئاگەدار بکە لێی, بۆ ئەوەی چاوەڕوانیت بێزاری نەکات و بە دیار خواردنەکەوە بە غەمباری نەمێنێتەوە و گلەی لێ پەیدا نەبێت.

هەروەها کاتێك هەر کامێکتان بۆ ئەنجامدانی پێویستیەکی خۆی چوە دەرەوە بەبێ ئاگەداری هاوسەرەکەی, یان درەنگ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە, با بە ئاسانی وەری بگرێت, مادام متمانە هەبێت لە نێوانتاندا و مادام ئەمە کارێکی هەمیشەی نیە و تەنها ناوبەناوێك شتی وا ڕودەدات.

43/ هەوڵبدە هەرکات میوانداری هەر کەسێکت کرد پێشتر خێزانەکەت ئاگەدار بکە لێی, بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکات, چونکە هێنانەوەی میوان بەبێ ئاگاداری هاوسەرەکان دلگران دەکات، دەتوانیت پێشوەخت ئاگەداریان بکەیتەوە بە تەلەفۆنێك، و خۆت دوربگریت لەو پشێویە.

44/ هەرکات کێشەیەك کەوتە نێوانتانەوە, هەوڵبدەن خۆتان چارەسەری بکەن و مەیگەیەنن بە ماڵە باوانتان, چونکە هەر یەکێك لە هاوسەرەکان کێشەیەك کە بە خۆیان چارەسەر بکرێت, بەڵام نەیکەن و بیگەیەنن بە ماڵی باوانیان, ئەوە دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی ڕێزی هاوسەرەکەی لای ماڵی باوانی و بەو هۆیەشەوە ئیتر نەك هەر هاوسەرەکەیان خۆش ناوێت, بەڵکو سەریش دەکێشێت بۆ ساردبونەوەی پەیوەندی لەگەڵ ماڵە باوانی ئەویش و ئەوەش

نەك هەر چارەسەری کێشەکەیان ناکات, بەڵکو بەرە و تەنگەشە و نا هەمواری زیاتریان دەبات.

45/ کاتێك هەڵسوکەوتێکت بینی لە هاوسەرەکەت, نابێت هێڵی سور ببەزێنیت بەوەی جنێو بدەی بەخۆی یان بە دایك و باوك و خوشکی, چونکە لەگەڵ ئەوەی کە ئەوەی کارێکی رێگە پێدراو نیە و حەرامە, سوکیشت دەکات لە پێش چاوی هاوسەرەکەت.

پێشینان وتویانە: جێگەی شمشێر چاك دەبێتەوە, بەڵام جێگەی قسە چاك نابێتەوە.

46/ زۆر بە دانای هاوەڵەکانت هەڵبژێرە, چونکە زۆر جار بەهۆی هاوەڵی نا دڵسۆزەوە کێشەی گەورەت بۆ دێتە پێش و بە ئاسانی لێی دەرباز نابیت, بۆیە گوێ بۆ هیچ هاوەڵێك شل مەکە کە بیەوێت بە ناوی دڵسۆزیەوە ناتەبای بخاتە نێوانتانەوە, چونکە بە تەنها یەك وشە لەوانەیە ماڵ وێرانت بکا.

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: نەکەن هاوڕێی خراپ بگرن.

47/ هەرکات کێشەیەکت هەست پێ کرد ئەگەر بچوکیش بێت, نەکەیت پشت گوێی بخەیت, چونکە کێشەی پشتگوێ خراو کەڵەکە دەبێت لەسەر یەکتر و دوای دەبێتە کێشەیەکی گەورە و بە ئاسانی چارەسەر ناکرێت.

48/ وەکو هاوڕێیەك بڕوانە لە هاوسەرەکەت و هەمیشە بە گفتوگۆ کارەکانتان ئەنجام بدەن و بە شێوەیەك ڕەفتاری لەگەڵ بکە کە تۆ پێت خۆشە زاواکەت ئاو ڕەفتار بکات لەگەڵ کچەکەت یان خوشکەکەت, چونکە ئەویش خوشکی کەسانێك و کچی خانەوادەیەکی وەکو تۆیە.

49/ ئازادی بدە بە هاوسەرەکەت و هەمیشە خۆت هەڵمەقورتێنە ناو کارەکانی ئەو با بە دڵسۆزیشی بزانیت.

50/ هەر شتێك دەزانیت کە لەوانەیە دوای هاوسەرگیری کێشەی لەسەر دروست ببێت, باشتر وایە پێش هاوسەرگیری بەرامبەری لێ ئاگەدار بکەیت, چونکە ئێستا پێك نەیەن باشترە نەك دوای گواستنەوە لێك جیا ببنەوە.

# وەرزی سێیەم

51/ ڕاستگۆبە لەگەڵ هاوسەرەکەت و هەرگیز هیچی لێ مەشارەوە, ئەوە دەبێتە هۆی زۆر بونی متمانەت لەلای ئەو.

52/ لەسەر بۆچون و داواکاریەکانت سور مەبە بە هەمیشەی و دەرفەتی ڕێکەوتنی با تیابێت, چونکە ئەگەر تۆ سوربیت لەسەر بۆچونی خۆت و هاوسەرەکەیشت بە هەمان شێوە ئیتر چۆن دەتوانرێت ڕێك بخرێنەوە.

53/ داوای زۆرت لە هاوسەرەکەت نەبێت با زۆر تۆیشی بەدڵ بێت و قسەت نەشکێنێت, بەڵام هەمو شتێك سنوری بۆ هەیە و زیادەڕەوی ڕۆژی ڕەش بە دوای خۆیدا دەهێنێت, جگە لەوەی ئەگەر هاوسەرەکەت دەرامەتێکی دیاریکراوی هەبێت ناتوانێت هەمو داواکانت بۆ جێبەجێ بکات و سور بونی تۆش لەسەر داواکانت کێشە بە دوای خۆیدا دەهێنێت.

54/ دور کەوتنەوە لە گوناح بە هەمو جۆرەکان, چونکە گوناح هەنگوینێکی ژەهراویە و نزیك بونەوە لێی خۆشی ژیانت دەمرێنێت و بەردەوام بەهۆی گرفتەکانتەوە کێشەی ڕۆژانەت بۆ دروست دەبێت.

55/ خۆ دورگرتن له كێشانی تلیاك و جگەرە و له خواردنەوە سەرخۆش كەرەكان, چونكه بەهۆیەوە سامان و خەرجی ماڵ و منالّت به هەدەر دەدەیت و تەندروستی خۆیشت دەخەیته مەترسیەوە, كەسایەتی خۆیشت لاواز دەكەیت و زۆر كەس بەو هۆیەوە وای لێهاتوە كه بكەوێته ژێر قەرزێكی زۆریشەوە, جگه له دروست بونی تورەی زۆر و شپرزبونیش له ژیاندا, كه هەمو ئەوانه كاریگەری گەورەیان دەبێت لەسەر تێكدانی شیرازەی خانەوادەكان, بۆیه پێشتریش توشی بوبێتی پێویسته قوربانی بدەیت پێیان و وازی لێ بهێنیت, له پێناو بەرقەراربونی كامەرانی ماڵەكەت.

56/ نەبردنه دەرەوەی هیچ نهێنیەكی نێوانتان, تەنانەت لای خۆشەویسترین كەسیشت نەیدركێنیت, چونكه هەمو خانەوادەیەك نهێنی و تایبەتمەندی خۆی هەیه و ئەوەش ڕاسپاردەیەكه له گەردنی هەردو هاوسەر و نابێت به ئاسای وەربگیرێت, هەروەها لەكاتی ناتەبایەكانیشدا هەر نابێت ئەو نهێنیانەی هاوسەرەكەت بدركێنی كه پێشتر لەبەر متمانه كردنی به تۆ دركاندویەتی له لات, چونكه هاوسەرەكان ئاشناترین كەسن بەنهێنی یەكتر و دركاندنیان كێشەی گەورەی لەسەر دروست دەبێت.

57/ کاتێك زانیت خێزانت لەبەر هەر سەرقاڵیەك خواردنی ئەو ژەمەی بۆ ئامادە نەکراوە, زۆر بە ئاسانی وەری بگرە و خواردنی دەرەوە بهێنەرەوە بۆ خۆت و بۆ ئەویش, کە ئەوە هۆکارێکی باشە بۆ زیادکردنی خۆشەویستی لە نێوانتاندا.

58/ هەر کاتێك کێشەیەك دروست بو لە نێوانتاندا هەرگیز ماڵی خۆتان جێ مەهێڵن و بمێننەوە لە شوێنی خۆتاندا, بۆ ئەوەی کەسی تر بە کێشەکانتان نەزانێت و سەر نەکێشێت بۆ خراپتر، لە نێوان ژن و مێردەکان کات دەبێتە چارەسەرێکی باش بۆ ڕێککەوتنەوەیان, زۆر جار دوای چەند کاتژمێرێك هاوسەرەکان بە خۆیاندا دەچنەوە و پەشیمان دەبنەوە لە هەڵوێستە نا دروستەکانیان.

59/ هەرکات هەڵەیەکت کرد بەرامبەر هاوسەرەکەت و پاشان بۆت دەرکەوت کە تۆ هەڵە بویت, دان بنێ بە هەڵەکەتدا و داوای لێبوردنی لێی بکە, چونکە دانىان بە هەڵە چاکەیە و گێڕانەوەی ئاسودەییە بۆ ناو دڵەکان, بۆیە کاتێك گلەیت لێکرا لە لایەن هاوسەرەکەتەوە لەسەر شتێك کە تێکتدا بو, هەرگیز پارێزگاری نادروست لە خۆت مەکە و مەڵێ تۆش لە من باشتر نیت و کێشە کۆنەکان مەدەرەوە بە ڕویدا, چونکە بە دەستی خۆت کێشەکە گەورەتر دەکەیت.

60/ دەست خۆشی بکە لە هەر کارێکی باش کە هاوسەرەکەت دەیکات, لە کاری ماڵەوە یان دەرەوە, چونکە سوپاس و دەست خۆشی لە بەرامبەرەکەت, هاندانێکی باشە بۆ باشتر کردنی کارەکان و برەودانە بە بەردەوامی خۆشەویستی نێوانتان و هۆکارێکی باشە بۆ سڕینەوەی ناتەباییەکانی پێشوتر.

61/ باس کردنی چاکە و باشیەکانی هاوسەرەکەت لای کەس و کار و هاوڕێکانی ئەو بەبێ ئاگاداری بە هەند وەربگرە, چونکە بەدڵنیاییەوە دەگاتەوە پێی و دڵخۆشی دەکات و دەبێتە نەمامێکی خۆشەویستی و لە دڵیدا جێگەی خۆی دەکاتەوە.

62/ هەرگیز هەوڵ مەدە ئەگەر یەکێك لە منداڵەکانتان هاروهاجیەکی کرد, گلەی بکەیت لە هاوسەرەکەت لەسەر ئەوە و توڕە نەبیت لێی, چونکە هەروەك منداڵی ئەوە منداڵی تۆیشە و هەرگیز دایك و باوك کەسیان حەزناکەن منداڵەکانیان لاساری و گوێ نەبیست بن, بۆیە دەبێت چارەسەری تری بۆ دابنرێت، یان ئەگەر دایك یان باوك بە مەبەستی پەروەردەی منداڵەکە جۆرێك لە توڕەی هەبو لەگەڵ منداڵەکانتان بە ئاسای وەری بگرە و کێشەی لەسەر دروست مەکە.

63/ هیچ جۆرە ناپاكیەك لە هاوسەرەكەت نەكەیت, بە ڕێگای نادروست بیر لەو كارانە نەكەیتەوە, چونكە پەیوەندیەكی زۆر بەهێز هەیە لە نێوان هەست و گیانی ژن و مێردەكاندا بەجۆرێك كە زۆر بە زوی ئاشكرا دەبێت كارە نادروستەكەت, ئەگەر لە ڕێگەی خەو بینینیشەوە بێت ئاگادار دەكرێتەوە لێی و بەو هۆیە بە دەستی خۆتماڵەكەی خۆت تێك دەدەیت, چونكە ناخ پێویستی بە بەستنەوە هەیە ئەگینا هەرگیز تێر نابێت و ژیانت پڕ كێشە دەكات، جا ئەو ناپاكیە ئەگەر بەشداربون لە چاتێكدا بێت یان لە ڕێگەی تەلەفۆنكردنێكی نادروست یان ئیمەیلێك یان هەر ڕێگەیەكی تر, ئەگەر مەبەستیشت پێی ناپاكی نەبێت و تەنها بۆ گاڵتە و كات بەسەر بردنیش بێت, یاخود لە ڕقی مێردەكەت, چونكە زۆر جار كاتێك مێردەكە ناپاكیكار بوە و خێزانەكەی پێی زانیوە, بۆ تۆڵەسەندنەوە لە مێردەكەی, ئەمیش هەوڵی ئەوەی داوە كاری ناپەسەند و سەر شۆڕكەر بكات, كە لە بنەڕەتدا خۆیشی پێی ڕەوانیە, ئەمە وەك ئەوە وایە كەسێك خۆی بسوتێنێت بە دەستی خۆی و تۆش لە ڕقی ئەو هەوڵ بدەیت خۆت بسوتێنیت, چونكە ناپاكی لە ژیاندا شكۆمەندی و ئابڕوت دەسوتێنێت و لە پاشەڕۆژیش دۆزەخ چاوەڕێتە, بۆیە مرۆڤی ژیر و تێگەیشتو ئەگەر نادروستی لە هەر كەسێك بینی دەبێت هەوڵی چارەسەری بدات, نەك خۆشی تێوە بگلێنێت, چونكە ئەو ناپاكیانە نەخۆشین و دەبێت وەك پزیشك چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە, كەواتە هەمو ئەوانە پێچەوانەی ئاكاری هاوسەری دڵسۆز و ڕۆشنبیرە و جگە لە نشوستی و تێكدانی

ژینی خۆت, شتێکی تری لێ بەرهەم نایەت و پەشیمانیش دواتر کەڵکی زۆر نابێت بۆتان.

64/ کاتێك هەڵەیەکت بینی لە هاوسەرەکەت, پێی مەڵێ: من پەشیمانم لەوەی تۆ بویتە هاوسەری من و تەنها لەبەر منداڵەکان ماومەتەوە لەگەڵتدا, چونکە لەوانەیە زۆر شت لە بیر بکات, بەڵام ئەمەیان نا, چونکە ئەوە زامێکی قوڵ دروست دەکات لە دڵدا.

65/ ئەگەر کێشەیەکتان هەبو, هەرگیز لە ژورێکی تر مەخەوە, چ جای ئەوەی بچیت لە ماڵێکی تر بخەویت, بۆ ئەوەی بۆشای گەورەتر نەکەوێتە نێوانتان, تەنانەت زانایان لە ڕاڤەی ئایەتی(...واهجروهن فی المضاجع...) سورةتی: النِساء-34

دەفەرمون: مەبەست ئەوە نیە کە شوێنی لێ جیا بکەیتەوە, بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەگەر کێشەیەکتان هەبو, بە مەبەستی چارەسەر کردن لەسەر ئەو جێگەی پێکەوە دەخەون پشت بکەنە یەکتر نەك زیاتر.

66/ هەر کاتێك کێشەیەکت هەبو لەگەڵ هاوسەرەکەت نەکەیت ئەرکەکانت پشت گوێ بخەیت, چونکە ئەوە وا دەکات کێشەکە گەورەتر بێت, مێردەکە دەبێت هەر وەکو ڕۆژان پێداویستی ماڵ ئەنجام بدات و خێزانیش کاروباری ماڵ وەك جاران ئەنجام بدات.

ئافرەتێکی دانا و سەنگینم لە بیر دێت, کاتێك لەگەڵ مێردەکەی کێشەیەکیان بو, مێردەکەی وا دەزانێت تۆراوە و چۆتەوە ماڵی باوکی, بەڵام ئەم ئافرەتە دانایە, دڵسۆزی خۆی و ماڵ و منداڵی بوە و کێشەی گەورەتر نەکردوە, کاتێك مێردەکەی دەچێتە دەرەوە بۆ کاروباری ڕۆژانە ئەمیش دەگەڕێتەوە ماڵ و ماڵەکەی پاك و خاوێن دەکاتەوە وەکو جاران خواردنیش ئامادە دەکات بۆ مێردەکەی و بۆ منداڵەکانی, کاتێك گوێی لە دەنگی مێردەکەی دەبێت نیوەڕۆ کە خەریکە دێتە ماڵەوە, بەپەلە دەچێتە ژوری پشتەوە و لەناو سندوقێك خۆی دەشارێتەوە بۆ ئەوەی مێردەکەی نەزانێت هەر لە ماڵە و وانەیەکیشی بە مێردەکەی بدات و جارێکی تر کێشە دروست نەبێتەوە, کاتێك مێردەکەی دەگەڕێتەوە ماڵەوە سەیر دەکات خواردن ئامادەکراوە و ماڵەکە پاك و خاوێن کراوەتەوە و خێزانیشی لە ماڵ نیە, سەری سوڕ دەمێنێت کێ ئەم کارانەی کردوە؟ بەدەم بیر کردنەوە بە ماڵەکەدا دەگەڕێ و سەرێکیش دەدات لە ژوری دواوە کراسی خێزانی دەبینێت بەلایەوە سەیرە ئەم کراسە بۆچی لەو سندوقە هاتۆتە دەرەوە!

چونکە لە پەلە پەلەیدا کە مێردەکەی هاتۆتەوە, نەیتوانیوە خۆی باش بشارێتەوە, بۆیە کاتێك سەری سندوقەکە هەڵدەداتەوە زۆر دڵخۆش دەبێت بەوەی کە خێزانی نەتۆراوە و هەر لە ماڵەکەدا ماوەتەوە, بۆیە تەنها بە خێزانەکەی دەڵێ: ئەوە لێرەیت! ئیتر ئاو دەکرێت بە ئاگردا و کەس باسی هیچ ناکات و دۆخەکە دەچێتەوە دۆخی جاران.

67/ کاتێك هاوسەرەکەت بەرە و کار دەچێتە دەر تا بەر دەرگا لەگەڵی برۆ و خوات لەگەڵی لەگەڵ بکە, ئەمە وا دەکات خۆشەویستی زیاتر بچەسپێت لە دڵدا و وا لەویش دەکات کە ئەم هەڵوێستەی لە بیر بێت و لەسەر کارەکەیەوە بە تەلەفۆن هەواڵت بپرسێت, ئەگەرچی زۆر جار پیاوان بەناوی ترەوە تەلەفۆن دەکەن بۆ هاوسەرەکانیان، بەڵام زۆر جاریش مەبەستیان خۆشەویستی هاوسەرەکانیانە.

68/ ئەگەر میوانێکی هاوسەرەکەت هات بۆ ماڵتان زۆر بە جوانی و بەرێزەوە هەڵسوکەوت بکە لەگەڵیان, چونکە خۆشەویستی زیاتر دەکات لە نێوانتاندا و دواتر ئەویش بە هەمان شێوەی تۆ جوان رەفتار دەکات لەگەڵ میوانەکانی تۆدا.

69/ هەڵبژاردنی بێدەنگی لە کاتی دروست بونی کێشە لەگەڵ هاوسەرەکەت, چارەسەرێکی گونجاوە بۆ زۆرێك لە کێشەکان.

70/ یارمەتیدانی ماڵی باوك کارێکی پێویستە, بەڵام نابێ زیادەڕەوی تێدا بکەیت, چونکە ماڵ و خێزانی خۆیشت مافیان هەیە لەسەرت و پێویستە ئەمانیش لە یاد نەکەیت.

بەشێك لە کێشەکان لەوەوە سەر هەڵدەدات کە مێردەکان زۆرترین داهاتیان بۆ ماڵە باوك و برا و خوشك و کەس و کاریان خەرج دەکەن و بەشێکی کەم دەهێڵنەوە بۆ ماڵ و منداڵی خۆیان و ئەمەش گلەی و نیگەرانی خێزانی لێدەکەوێتەوە و پێویستە بە وریای ڕەفتار بکرێت لەم نێوەندەدا.

71/ هەوڵ مەدە لەسەر حیسابی هاوسەرەکەت پێگەی خۆت بەهێز بکەیت, بەهێزترین پێگەی هاوسەرەکان لە تەبای و هەماهەنگیدایە نەك شتێکی تر.

72/ هەر کاتێك دەرامەتت هەبو ماڵێك بکرِیت بۆ ژیانتان دوای مەخە, چونکە زۆر ماڵ گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر نا ئارامی لێ دەکەوێتەوە.

73/ هەوڵ بدە بە پێی بەڕەکەی خۆت پێ ڕابکێشە و خۆت مەخەرە ژێر باری قەرزەوە کە نەتوانیت بیدەیتەوە و لێ پرسینەوەی بەردەوامی خاوەن قەرزەکان هاوسەرەکانماندو دەکەن و کێشەی خێزانی لەسەر پەیدا دەبێت.

74/ خۆت بە بەرپرسیار بزانە بەرامبەر ماڵ و خێزانت و لاموبالات مەبە, چەندە تۆ بە تەنگ ماڵ و منداڵەکانتەوە بیت ئەوەندە ڕێز و خۆشەویستیت زیاد دەکات لە بەردەمیاندا.

75/ لە بۆنە و خۆشیەکاندا هەرگیز خۆت بە کەم مەگرە لە پێش چاوی ئامادەبواندا و باشترین پۆشاکت لەبەر بکە, چونکە چەندە بە لێهاتوی و بە سەنگینی ببینرێیت لە لایەن هاوسەرەکەتەوە, ئەوەندە خۆشەویست تر دەبیت و پێگەت بەهێز تر دەبێت لای.

# وەرزی چوارەم

76/ هەوڵ بدە کاتێك هاوسەرەکەت پێی خۆش بو جل و بەرگێکی تایبەت لەبەر بکەیت, بە گوێی بکە ئەگەر جلێکی ناپەسەند نیە, چونکە دەبێتە هۆی زۆر بونی خۆشەویستی نێوانتان.

77/ هەندێك هاوسەر هەمو هەوڵێکی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی مێردەکەی دورە پەرێز بکات لەماڵی باوانی و تەنها قۆرخی بکات بۆ خۆی و هەمو ڕێگایەکی نادروست دەگرێتە بەر بۆ سەرگرتنی نەخشەکان, لە ڕاستیدا ئەوە بڕیارێکی زۆر هەڵە و نامرۆڤانەیە و دوربێت یان نزیك ئەو ماڵە ئارامی لە دەست دەدات و سەرکەوتو نابیت لە نەخشەکەت, بۆیە هاوسەری دڵسۆز و دانا ئەوەیە کە بتوانێت بە دەستێکی مێردەکەی ڕاگیر بکات و بە دەستەکەی تریش ماڵە باوانی, ئەوە هۆکاری کامەرانی ماڵە نەك بە پێچەوانەوە.

78/ هەوڵ بدە هەرگیز دەنگ بەرز نەکەیتەوە بەسەر هاوسەرەکەتدا لە کاتی ڕودانی هەر ناکۆکیەك, بەڵکو هەوڵ بدە دان بە خۆدا بگرە و بە نەرم و نیانی و بە وشەی شیاو و گونجاو, پارێزگاری لە خۆت بکە و داواکەی خۆت بگەیەنە.

79/ بەشێك لە كێشەكان دەرەنجامی دو بۆچونیە لەسەر بە شودانی كچەكانیان یان ژن هێنان بۆ كوڕەكانیان, بۆیە ژن و مێردی دانا و ڕۆشنبیر ئەوانەن كە بەتەبای و لێك تێگەیشتنەوە هاوسەرگیری بۆ منداڵەكانیان ساز دەكەن.

80/ هەندێ ماڵە باوان ڕۆڵێكی نەرێنی دەبینن لە نێوان هاوسەرگیری منداڵەكانیان, بۆیە زۆر پێویستە ژن و مێرد بۆ خۆیان تەبا و گونجاو بن و ڕۆڵی ناتەندروستی ماڵە باوانیان كاریگەری خراپ دروست نەكات لەسەریان.

81/ هەرگیز توانج مەدە لە هاوسەرەكەت و گاڵتەی وای لەگەڵ مەكە كە پێی ناخۆش بێت, بۆ ئەوەی تەبای نێوانتان بۆشای تێ نەكەوێت, بە تایبەت زۆرێك لە پیاوان ڕۆژانە خێزانەكانیان ڕادەچڵەكێنن بە ناوهێنان و باسكردنی هێنانی ژنی دوەم, كە زۆریشیان ئەگەرچی دڵخۆشن بە هاتنەدی ئەو خەونە, بەڵام دەزانن زۆر دورە بۆیان بگونجێت و تەنها وشەیەكە زاری ئاسودە كردون, لەوانەیە هێنانی ژنی دوەم ئاسان تر بێت لەو داخ كردن بە دڵانەی ڕۆژانەی مێردەكانیان, بە باسكردنی ژنی تر.

پێشینان وتویانە: پێوەدان باشترە لە زیرە زیری زەردەواڵە.

82/ ئەگەر ویستت هەڵەیەکی هاوسەرەکەت چارەسەر بکەیت ڕەخنەی لێ مەگرە, بەڵکو بە ڕێگای هاندان و پێشنیار ڕەخنەکانی خۆتی پێ بگەیەنە.

83/ زۆرێك لە خانەوادەکان زو دەکەونە ژێر کاریگەری دەوروبەریان و هەمیشە داواکاری زۆریان دەبێت و بەو هۆیەوە بە دەستی خۆیان ماڵی خۆیان تێك دەدەن و هەمیشە چاو لەسەرو خۆیان دەکەن, بۆیە بە مەبەستی ڕێگە چارەی گونجاو سەردانی چەند ماڵێکی پێ بکە کە بژێوی و دۆخیان لە خوار ئێوەوە بێت, ئەوکات سەقامگیری زیاتر دەکەوێتە نێوانتانەوە.

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: ئەگەر سەیری سەروی خۆتان کرد, سەیری خواروی خۆیشتان بکەن ڕێکی دەکاتەوە.

84/ هەوڵبدە کارە باشەکانت لە قسەکانت زۆرتر بێت و بەردەوام وتارەکانت هاوشێوەی کردارەکانت بێت.

85/ هەرکاتێك هاوسەرەکەت ویستی قسەت بۆبکات گوێی لێبگرە و بەهەند وەریبگرە لێی, باوا نەزانێت کە ڕێز بۆ قسە و پێشنیارەکانی دانا نێیت و بەو هۆیەوە خۆشەویستی نێوانتان کەم بکاتەوە.

86/ مانەوەی ڕۆژانە بە دیاری کۆمپیتەر و فەیسبوك و ئینتەرنێت, وات لێدەکات کە هاوسەرەکەت لێت بێزار ببێت و نارەزابێت بەو کارەت و سەرەتایەك دەبێت بۆ دروست بونی کێشە و دارمانی ئارامی ماڵ, پێشینان وتویانە: هەمو شتێك بە خوێ و خوێش بە مانا, بۆیە پێویستە لەگەڵ ئەنجامدانی ئەوانەشدا کاتێکیش دیاری بکەیت بۆ هاوسەرەکەت, چونکە هەرشتێك زیادەڕەویت تێداکرد, واتای وایە لایەکی ترت فەرامۆش کردوە و دەبێت بەئاگا بیت لێی.

87/ زۆرێك لەو هاوسەرانەی کە خێزانەکانیان زمانیان جیاوازە یان بە شێوە زارێکی تر قسە دەکەن, پێویستە لە کاتی تێکەڵ بونیان بە کەسانێکی تر کە بە زمان یان شێوە زاری تر قسە دەکەن چەند دەتوانن بە زوبانێك یان شێوە زارێکی یەکسان قسە بکەن بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەیان بێزار نەبێت, کە چەند کاتژمێرێك قسە بکرێت ئەم هیچی لێ تێ نەگات, زۆر جار لەوانەیە ئافرەتەکە شەرم بکات و لە ڕوی نەیەت پێیان بڵێت بێزار بوم, ئەرکی سەرشانی مێردەکەیەتی کە داوا بکات لە ئامادەبوان کە بە شێوەیەك بدوێن کە هەموان لێی تێ بگەن, بۆیە جار و دوجار لەوانەیە ئاسای بێت بەڵام ئەگەر بەشێکی زۆر لە ژیانیان بەم شێوەیە بێت بە دڵنیاییەوە نیگەرانی لەسەر دروست دەبێت و سەرەنجامی باشی نابێت, ئەمە جگە لەوەی نا دادپەروەری دەرهەقی ئەو کەسە دەکرێت, ئیتر ئەو کەسە کورد بێت یان نەتەوەیەکی تر,

له كاتێكدا ئەمڕۆ خەڵكانێكی زۆر هاوسەرگیری دەكەن لەگەڵ شێوە زارەكانی تر وەك بادینی, هەورامی, كرمانجی یان ئەو ڕێژە زۆرەی هاوسەرگیریان كردوە لەگەڵ پاكستانی و هندی و ڕوسی و عەرەب و ئینگلیز و وڵاتانی ئەوروپی هتد.

88/ نەبونی بەرنامە و سستی لە بەڕێكردن و بەڕێوەبردنیماڵدا شكۆی مێرد ناهێڵێت لە پێش چاوی ماڵ و خێزانەكەیدا و پەرتەوازەی و پچڕانی شیرازەی خێزانی لێدەكەوێتەوە, بۆیە گورج و گۆڵی لە دانانی پێداویستیەكان هێزێك دەداتە مێردەكە و شكۆی زیاتر دەكات و دەبێتە هۆكاری چاوپۆشی بەشێك لە هەڵەكانی پێشوی لەلایەن هاوسەرەكەیەوە و خۆشەویستی زیاتر دەكات.

89/ ڕوكار هەمو شتێك نیە, بەشێك لە هاوسەرەكان (ژن یان مێرد) كاروباری ماڵیان فەرامۆش كردوە و هەمو تواناكانیان بۆ ڕوكار و ڕوكەشی دەرەوەی خۆیانە لە پۆشاكی جوان و خۆڕازاندنەوەی خۆیان, ئەگەرچی ئەمە كێشە نیە و كارێكی باشە, بەڵام بە هاوشانی پەراوێز نەخستنی پێداویستیەكانی ماڵ و منداڵ و بەڕێوەبردنی بە شێوەیەكی تەندروست, چونكە ڕوكەش و ڕوخسار ئەگەر ڕەنگدانەوەی بەڕێوەبردنێكی بەهێز نەبێت شكۆمەندیت پێنابەخشێت و بگرە لە پێش چاو نزم دەبیتەوە و لە پێش هەمو شیانەوە لە پێش چاوی

هاوسەر و منداڵ و کەس و کارت و بە مەش هەمیشە ناتەبای یاوەری ماڵەکەت دەبێت و وا دەکات لە بەرامبەرەکەشت کە دڵسۆزی زۆر بە خەرج نەدات بۆت و خۆشەویستی بار بکات لەو ماڵەدا, لە لایەکی تریشەوە کەمتەرخەمی کردن و نەپۆشینی پۆشاکی جوان لای هاوسەرەکانەوە ئارامی دڵەکان دەپروێنێت, پیاوان کاتێك کار دەکەن و دەگەڕێنەوە ماڵەوە نابێت بە پۆشاکی کارەوە زۆر بمێننەوە یان هەر بەو پۆشاکانەوە سەردانە کۆمەڵایەتیەکان ئەنجام بدەن, کە بۆنی ئارەق و چڵکی لێدێت, خێزانەکان پێیان خۆشە هەمیشە هاوسەرەکانیان بۆن ناخۆش و کەمتەرخەم نەبن, بەهەمان شێوەیش ئافرەتان نابێت بەجل و بەرگی کارکردنی ماڵەوە, بە هەمیشەی پێشوازی لە هاوسەرەکانیان بکەن, بەڵکو پیاوان ئارەزومەندی ئەوەن کە هاوسەرەکانیان بەو پەڕی ڕوخسار جوان و شایستەدا پێشوازیان لێبکرێت, ئەگەر هەردولا بە دڵی شاد و کامەران چاویان بە یەکتری هەڵنەیەت, بێگومان دڵخۆش نابن بە یەکتر و خۆشەویستی نێوانیان ڕو لە کزی دەکات و ئەمەش لە بەرژەوەندی ئەواندا نیە.

90/ هەندێك لە پیاوان کاتێك لە دەرەنجامی دروست بونی ناتەباییەك گوێیان لە تەنها وشەیەکی زبر دەبێت لە هاوسەرەکانیانەوە, سەری دونیا لە خۆیان دەهێننەوە یەك و دەڵێن: چۆن دەبێت ژن وەڵامی مێرد بداتەوە !

لە کاتێکدا لەوانەیە خۆی دەیان جار لەو وشانە و خراپتریشی بەو وتبێت و وەڵامیشی نەدابێتەوە و ئاو کرابێت بە ئاگردا و بە لایشیەوە ئاسای بوبێت, لە

کاتێکدا هەر دوکیان مرۆڤن و هەر دوکیان وشەی زبریان پێ زبرە و وشەی شیرینیان پێ خۆشە.

عومەری کوڕی خەتاب (ڕ.خ) ڕۆژێکیان لەسەر شتێك کە ڕویدا بو لەگەڵ خێزانی, هاوسەرەکەی پارێزگاری لە خۆی کردبو بە وشەی جوان وەڵامی دابویەوە, بەلایەوە سەیر بو چونکە پێشتر ئافرەتانی قوڕەیش وەڵامی مێردەکانیان نەدەدایەوە, بەڵکو چاویان کردبو لە هاوسەری پشتیوانان خوایان لێ ڕازی بێت, بۆیە کاتێك پرسیاری لە خێزانی کردبو, ئەوە چۆن بو وەڵامت دامەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: خێزانەکانی پێغەمبەر (د.خ) هەر وا دەکەن! دەڵێ کەواتە ئەوان کەوتونەتەبەر توڕەی خوای گەورە, بۆیە خێرا دەڕوات بۆلای حەفسەی کچی, کە هاوسەری پێغەمبەری خوا دەبێت (د.خ) کاتێك پرسیاری لێ دەکات, ئایا ئێوەش وا دەکەن؟ ئەڵێ بەڵێ, هەندێکیان بە درێژای ڕۆژێك قسە ناکەن لەگەڵ پێغەمبەری خوا (د.خ).

91/ کاتێك زانیت کێشەت هەیە لەگەڵ هاوسەرەکەت و چارەسەر نابێت بۆت، هەوڵبدە دوریەك بسازێنە بۆخۆت، کە بۆنی کێشەی لێ نەیەت، وەك سەردانیەکی چەند ڕۆژی بۆ لای هەندێك خزم و کەسوکار یان بۆ دۆزینەوەی کارێك یان بۆ سەردانی نەخۆشێك یان هەر بیانویەکی گونجاو، دوری ئەو چەند ڕۆژە چارەسەرێکی باش دەبێت بۆ بە خۆدا چونەوەی

هەردولا و هۆکارێکی لەبارە بۆ گەڕانەوەی سەرەتایەکی خۆشەویستی بۆ نێو ماڵەکەتان.

**92/** زۆر مانەوەی مێرد لە ماڵەوە بەبێ پاساو، یان لەبەر بێکاری، یان هەر هۆکارێکی تر، لە شکۆی پیاو کەم دەکاتەوە و خۆشەویستی کەم دەکاتەوە لای هاوسەر، بۆیە بۆ گێڕانەوەی ئەو خۆشەویستیە پێویستە هەوڵی کارێك بدات و دەست بەکار بێت و ڕۆژانە مانەوەی لە ماڵ کەمتر بکاتەوە یان هەر نەبێت سەر قاڵیەکی گونجاو بۆ خۆی بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ئەو کەلێنە پڕ بکانەوە.

**93/** کاتێك هەواڵێك یان بۆچونێك یان هەر ناتەبایەکت بیست لە هاوسەرەکەت، پەلە مەکە لەبڕیاردان و یەکسەر بڕوا مەکە بەوەی بیستوتە، چونکە هەمو کەسێك دۆست و دوژمنی هەیە و بەدواداچونی گونجاو بکە بۆ ئەو کارەی دڵنیگەرانی کردویت، سەرەتا پرسیار بکە لە هاوسەرەکەت کەچی ڕویداوە و بۆچی ڕویداوە، چونکە زۆ جار ئەوەی بۆت دەگێڕنەوە جیاوازە لەوەی کە لە کەسەکە خۆی دەیبیستیت.

**94/** ئەگەر زانیت هاوسەرەکەت لێت ڕەنجاوە و قسەت لەگەڵ ناکات و بۆت ئاشت نابێتەوە، بە ئاسانی وەری بگرە و کارەکە قورس مەکە، بچۆ بۆ بازاڕ خەڵاتێکی بۆ بکڕ و لەسەر جێگەکەی خۆی بۆی دانێ و لەسەری بنوسە بۆ هاوسەرە خۆشەویستەکەم، بەبێ دەنگی بمێنەوە و پێی مەڵێ خەڵاتم کڕیوە بۆت، بزانە وردە وردە ئەو ناتەباییە دەڕەوێتەوە و خۆشەویستیەکە دێتەوە دۆخی جارانی خۆی.

**95/** بە چاوی چاودێری سەیری هاوسەرەکەت مەکە و تەنها بۆ بژاردنی هەڵەکانی ئەو، کاتەکانت بەفێڕۆمەدە، چونکە گەر بە دوای هەڵەدا بگەڕێی، تەنها یەك کەسیشت دەست ناکەوێت بێ هەڵەبێ و دەست بەتاڵ دەمێنیتەوە، ژینیشت پڕ دەبێت لە تەنیای و خەمۆکی و بێ متمانەی بەرامبەر هەموان کە ئەوەش گۆڕ هەڵکەندنە بۆخۆت بە دەستی خۆت.

**96/** مرۆڤەکان بەهۆی کار و بژێوی پەیداکردنەوە بە دڵنیاییەوە دڵتەنگ دەکرێن لە لایەن هاوڕێکانیان یان خاوەن کارەکان یان کڕیارەکان، هەروەها بۆ خۆشیان کاریگەری ماندوبونیان لەسەر دەبێت، بۆیە کاتێك دەگەڕێنەوە ماڵ دەبێت کەشێکی لەبار و خەم ڕەوێن بڕەخسێت لای هاوسەرەکەیەوە تا دڵتەنگی ئەمڕۆی لە بیر بچێتەوە و ماندوی بحەسێتەوە، دواتر ئەگەر داوایەکت هەبو لێی لە دۆخێکی گونجاو داواکەت بڵێ پێی، بەڵام ئەگەر

دوای ماندوی و دڵتەنگی هاوسەرەکەی داوایەکی گەورە یان هەواڵێکی ناخۆشی پێ بدات بە دڵنیاییەوە ڕەنگدانەوەی خراپی دەبێت بۆ هەردولایان، یاخود هەندێ لە پیاوان کاتێك دەگەڕێنەوەماڵەوە، شەڕی ماندوبون و دڵتەنگیان لەگەڵ خەڵکی، بە هاوسەر و منداڵە بێتاوانەکانیان دەفرۆشن و لەسەر ساکارترین شت توڕە دەبن لێیان و دڵیان دەڕەنجێنن، کە ئەمە ستەمێکی گەورەیە و نەك هەر ئارامی پێ نابەخشێت، بەڵکو ڕەوشەکە لە خراپەوە بۆ خراپتر دەبات و ئاوەدانی ماڵەکەشتان تێك دەدات.

**97/** هەندێ جار دەکرێت یەکێك لە هاوسەرەکان دەست بەتاڵ تر بێت لەوی تر و ئارەزومەندی قسەکردنی زیاتریش بێت، هاوسەرەکەشی کەم دوبێت و بە قسەی زۆر بێزاربێت، ئەوەیش هۆکارێکی ترە بۆ دروست بونی ناتەبای لە نێوانیاندا، بۆیە زۆر پێویستە هاوسەرەکان پاش ئەوەی یەکتریان ناسی و ئاشنای یەکبون بە خاڵە بەهێز و لاوازەکانی یەکتر، کارێك یان داوایەك نەکەن لە یەکتر کە پێچەوانەی خواستی بەرامبەرەکەی بێت یان لەگەڵ سروشتی ئەو نەگونجێت.

**98/** خوای گەورە مارەی دیاری کردوە وەکو مافێکی دروست بۆ هەمو ئافرەتێك کە شوبکات و بەرپرسیار نیە لە خەرج کردنی بۆ ماڵ و مێرد مەگەر لەکاتی ناچاری و پێویست یان ڕەزامەندی خودی خۆی، بۆیە

**هەندێك لە مێردەكان كاتێك ئاڵتونەكانیان پێ دەفرۆشن و دوایش بۆیان ناكڕنەوە، ئەوە لەگەڵ ئەوەی بێویژدانی كردوە بەرامبەر هاوسەرەكەی، دروست بونی هەستێكە لای خێزانەكەی كە مێردەكەی ستەمی لێدەكات و هۆكارێكیشە بۆ كەم كردنەوەی دڵسۆزی لە ماڵەكەدا و كەشێكی نائارام دروست دەبێت لەو نێوەندەدا.**

**99/ زۆرێك لە پیاوان وشەی تەڵاق بە هەمیشەی ویردی سەرزاریانە و بەڕاست و ناڕاست بەردەوام بەكاری دەهێنن، بەم كارەیان هاوسەرەكانیان هەمیشە لە دڵەڕاوكێ و بێ هیوایدا دەهێڵنەوە و دواتریش دەست دەكەن بە پشتێنی ئەم و ئەودا بە قوربان و بە ساقەیان دەبن بۆ ئەوەی تەڵاقەكەیان بۆ چاك بكەنەوە، دواتریش ماوەیەكی زۆر نابات پاش چاك بونەوە دەست پێدەكەنەوە وەكو جاران، هەروەكو نە بایان دیبێت و نە باران.**

**بۆیە ئەوانە هاوسەرەكانیان ماڵوێران دەكەن و ئارامی ماڵ تێك دەدەن و پێویستە دەست هەڵبگرن لەو كارە دزێوە و ئەو وشە بە تەواوەتی بسڕنەوە لەسەر زاریان و بەكاری نەهێنن، بۆ ئەوەی ئاسودەی بگێڕنەوە نێو ماڵەكانیان.**

**100/ تێڕوانینی خەیاڵی بۆ هاوسەرەکەت دەبێتە دڵ هەڵکەندنت لە خۆشەویستی ئەو، چونکە هیچ هاوسەرێك نیە کە هەمو ئاواتەکانی تۆی تێدا بەدی بکرێت، چونکە مرۆڤەکان بێ کەم و کوڕی نابن و ئەگەر لە هەندێك لاوە ئەرێنی بن لە هەندێکك لای ترەوە نەرێنی دەبن، بۆیە نابێت بەدوای جواندا بچیت و پێویستە ڕازی بیت بەو قەدەرەی کە هەڵتبژاردوە و خۆت بگونجێنیت لەگەڵی، بۆ ئەوەی پێکەوە ژیانتان بەردەوام بێت و پشێوی تێ نەکەوێت.**

**کـــــــــــــــــــــــــــــــــــــۆتایـــــــــــــــــــــــــــــــــــــی**

